بەردەم یاسا ئێشکچییەک لەبەر درگا قیت ڕاوەستابوو. پیاوێکی دێهاتی هات و ویستی کە لە یاسا بچێتە ژوورەوە. بەڵام ئێشکچییەکە گوتی کە ئەمێستاکە ناتوانێ بهێڵێت بچێتە ژوورەوە. ئەو پیاوە کەوتە بیرەوە و پرسی دەکرێ دواتر بچێتە ژوورەوە؟ ئێشکچی گوتی:" ئەگەری هەیە بەڵام نەک ئێستا." ئێشکچی لە پێش درگاکەوە کە هەموو کات کراوە بوو، تێپەڕ بوو، ئەو پیاوە نوشتاوە بۆ ئەوەی ژوورەوەی ئەوێ ببینێت. ئێشکچی ئاگادار بوو و گوتی:" گەر بە هۆی بەرگری من ئێرە هێندە سەرنجی تۆی ڕاکێشاوە هەوڵ بدە تێپەڕ بیت. بەڵام لەیادت نەچێت کە من توانام و دواهەمین ئێشکچیش نیم. پێش هەر ژوورێک ئێشکچییەک تواناتر لە من بوونی هەیە، تەنانەت من ناتوانم خۆم لە بەرانبەر بینینی ئێشکچی سێوەمی دوای خۆم، ڕاگرم." پیاوی دێهاتی تەمایەر چۆن کێشە گەلێک نەبوو، ئایا نابێت یاسا بۆ هەمووان و داییمە لە بەردەست بێت، بەڵام ئێستا کە لە نیزیکەوە سەیری کرد و ئێشکچییەکەی لە جلی کەپەنکی پەشمی بە لووتێکی نووک تیژ و ڕیشی تاتاری درێژ و کز و ڕەش دی بە باشی زانی کە چاوەڕوان بێت تا بەو ڕێگای چوونە ژوورەوە بدەن. ئێشکچی چوارپایەیەکی پێ دا و برێک دوورتر لە درگاکە داینیشاند. ئەو پیاوە لەوێ ڕۆژان و ساڵگەلێکی زۆر دانیشت. هەوڵی زۆری بۆ ئەوەی کە لە ژوورەوە قەبووڵی کەن دا و ئێشکچییەکەی بە پاڕانەوەو داواکاری زۆر هیلاک کرد. جاری وابوو ئێشکچی لەو پیاوە پرسیارگەلیکی کورتی دەکرد. سەبارەت بە نیشتمانەکەی و زۆر بابەتی دیکە پرسیاری لێ کرد. بەڵام ئەم پرسیارانە لە سەر بێ بایەخی و بە جۆری پرسیاری گەورەکان لە بن دەستەکانیان

بوو و له کۆتایی دا دووپاتی دەکردەوە کە ئێستاش ناتوانێ ڕێگا بدات کە ئەو بڕوات. ئەو پیاوە کە بە تەواوی کەرەسەی ڕێبواری ڕازابووە. بە تەواوی کەرەسەکان بە هەر ڕێگایەک بوو دەسبە داوێن بوو_ بۆ ئەوەی کە ئێشکچییەکە بخەڵەتێنێ. ڕاستە کە ئەویش تەواوی ئەوانەی وەردەگرت بەڵام زیادی دەکرد:" من تەنیا هەڵیاندەگرم بۆ ئەوەی متمانەت بێت هیچ شتێکت لە بیر نەچووە." ساڵ بە دوای یەکدا پیاو بەردەوام سەیری ئێشکچی دەکرد. ئێشکچییەکانی دیکەی لە یاد کرد. ئێشکچی هەوەڵ بەڕای ئەو تەنیا کۆسپ بوو. ساڵە هەوەڵەکان بە دەنگی بەرز و چاو نەترسانە نزای لە چارەنووسی شوومی خۆی دەکرد. دواتر کە پیرتر بوو لە ژێر لچەوە بۆڵەبۆڵی دەکرد. لە کۆتاییدا بووە بە منداڵ و چون ساڵانێک بوو کە ئێشکچی لە ژێر چاوەوە دێری بوو_ تەنانەت ئەسپێی جلە پەشمییەکانیشت دەناسی داوای لەوان دەکرد کە یاری دەری بن. تا ئەوەیکە لە کۆتاییدا چاوەکانی کز بوون بە جۆرێک لە ڕاستیدا نەیدەزانی کە دەور و بەری تاریک تر بوون یان چاوەکانی دەغەڵی دەکەن. بەڵام ئێستا لە تاریکیدا گڕێکی بە شکۆی دەناسییەوە کە هەمووکات لە درگای یاساوە دەگەشاوە. ئێستا کە لە تەمەنی ئەو هێندەی نەمابوو. پێش لە مەرگی تەواوی تاقیکردنەوەکانی کە لە تەواوی ئەم ساڵانە لە سەری کۆ ببوونەوە بە پرسیارێک دەگەیشتن کە تا ئێستا لە ئێشکچییەکەی نەپرسیبوو. دەستێکی بۆ ڕاکێشا چونکە بەو لەشە کز و وشکەڵەی ئیدی نەیدەتوانی هەستێت. ئێشکچی درگای یاسا ناچار بوو زۆر بنووشتێتەوە، چۆن جیاوازی نێوان باڵاکان بە زەرەری پیاوی دێهاتی تەواو گۆڕابوو و لە ئێشکچییەکەی پرسی:" گەر هەرکەسێک خوازیاری یاسایە، چۆن دەبێت لە تەواوی ئەم ساڵانە کەسێکی دیکە جگە لە من داوای چوونە ژوورەوەی نەکردبێت؟" ئێشکچی درگا کە هەستی دەکرد ئەم پیاوە لەسەرە مەرگایە بۆ ئەوەی کە پەردەی گوێی باشتر بجووڵێنێتەوە لە گوێیدا هاواری کرد:" لێرەوە هیچ کەس جگە لە تۆ نەیدەتوانی بچێتە ژوورەوە، چونکە ئەم درگایەیان بۆ چوونە ژوورەوەی تۆ ساز کراوە. ئێستا دەڕۆم و درگاکە دەبەستم."